# ڕشتەی پێغەمبەر

## (صلى الله عليه وسلم)



دانانی

مامۆستا مەلا ئەحمەدی : ئەحمەد ئاوا

( ڕەحمەتی خوای لێ بێت )

چاپی : یەکەم

١٤٢٢ هـ ٢٠٠١ م

# ڕەوشتی پێغەمبەر


داناني

ماموّستا ملا احمدی :أحمد اوا

رەحمەتی خوای لێ بێ


چاپی یەکەم





٢٠٠١م ١٤٢١هـ

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ گلاڵەی یادگاری وێنەیەکمان ﴾

کرداری کەردوون کەلالـەی نەبەد
غونچەی جوانیم وەرانی قەد قەد
پەردەی ڕەشی دا بەسەریا بێحەد
مەر هەر بناڵم تابەردی نەلحەد




پاش سەبتیش نەکەم وێنەی شێوە بەد
لەنێوان ڕیزی خاسانی نەمجەد
بەهیوای نەوڕۆژ نەلەرزێ جەسەد
فریادی (احمد) بگا (محمد)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله خصوصا على محمد مصطفى وآله وصحبه المجتبى .

پاشان : سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار ،کە ئەوەی بۆ ڕەخساندم. کە ئەم بەرهەمەی باوکی بەڕێزم بخەمە نێو کتێبخانەی کوردی یەوە ، ئەم بەرهەمە هەر لەساڵی ( ١٩٦٠) دا نووسراوە ، بەڵام بەداخەوە چەرخی ژیانی باوکم بەو شێوەیە ڕێك کەوتووە ، کە چاوی بە چاپخانە نەکەوێت ، بەڵام لە لایەکی ترەوە قەدەری پەروەردگاریش وا نەبێت ، کە بەر لێشاوی سوتان و تیا چوون نەکەوێت ، وەك دیکەی بەرهەمەکانی مامۆستای ڕەحمەتی . بەڵام، پاش کۆچی دوایی دانەر ، بەندە هێشتا لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بووم و زۆرێکیش لە زانستی شەرعی و چاپ و چاپخانە بێئاگا بووم . بەڵام پاش ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی دام بۆ خوێندنی زانستە شەرعی‌یەکان و دەست و دڵی کردمەوە ، بەوەی کە بەردەوام بم لەسەر خوێندن و لەوەشدا بەهرەمەندی کردم "الحمدلله" بەرەو نووسینیش بچم . ئیتر هەرلەو کاتەدا ، سەیرێکی پاشماوەی ئەو کتێبانەی باوکمم کرد ، کە لە لێشاوی سوتان و تیاچوونی کیمیا بارانی (١٩٨٨) ڕزگاریان بوو بوو . ئەم بەرهەمی (رشتەی پێغەمبەر)م دەست کەوت ، وبیرم لە چاپ کردنی کردەوە . سەرەتا ڕووم و یەکێك لە دەزگا ڕۆشنبیرەکانم کردەوە ، بەڵام ڕەد کرایەوە و گوایە لەگەڵ نەهجی بڵاوکردنەوەکەیاندا ناگونجێت !! ئیتر بۆ ماوەیەکی تر هەر بە دەستنووس مایەوە ، تا خوای گەورە وای کرد کە یەکەم بەرهەمی خۆم کەوتە بەردەست و شتێك لە کاروباری چاپ و بڵاوکردنەوە فێر بووم ، دەستم

بە کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی باوکم کردوو . ئەم کتێبەم کردە یەکێك لە چاپکراوەکانی ئەو بیرە نوێیەم .

هەرچۆن بێ ، ئەوا ئەم ئاواتەی باوکیشم هاتە دی ، بەڵام بەداخەوە کە ئێستا باوکم چاوی لێی نییە ، و ئاواتی بەدی هاتووی نابینێ !!

وەخوێنەری سەنگینیش لەوە ئاگادار دەکەمەوە کە ئەم دانراوەی باوکم ، لە بەرهەمی یەکێك لە زانا گەورەکانی کوردە وە وەرگێراوە و پێدەچێت هەندێ شتی تێدا بێت کە ضعیف بێت بەڵام بەرهەمی مرۆڤ بەبێ کەم و کوڕی نابێت. ئەوا أصلی مەتنەکە . "الحمد لله " کەوتە بەردەست . ئەگەر خوا یارمەتی دام و زیاتر بە زانستی شەرعی بەهرەمەندی کردم لە داهاتوودا ، شەرحێکی لەسەر دەنووسم و ئەوەی ڕێك بکەوێت ((مدلّل)) ی دەکەم انشاءالله.

خوای گەورە یاوەری هەموولایەك بێت . لە باوکی ئازیزم خۆش بێت و بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات . بۆ خاتری ناوە جوان و صیفاتە بەرزەکانی . آمین .

أضعف العباد

عبدالله ملا احمد

احمد آوایی

٢/٢٣/ ٢٠٠١ ز - ذي القعدة/ ١٤٢١هـ

احمد آوا ـ شاردزوور

## ﴿ کورتەیەك لە ژیانی دانەر ﴾ [1]

دانەر ناوی (احمد)ە کوڕی (ملا شێخ محمدی کوڕی شێخ عبدالله ی کوڕی شێخ حمه مورادی ) سەرگەتی یە لە هەورامان [2]

## ﴿ جەمسەری هۆزی دانەر ﴾

جەمسەری هۆزەکەی لەنەتەوەی ئیمامی عومەرە . خوای لێ ڕازی بێت . وەئێستاکەش هەر بەولەقەبەوە ئەناسرێن بەتایبەتی لە ئێراندا کەبە فامیلی (فاروقی ) ناسراون ، وە هەندێکی ئەم هۆزەش بە ( نەقشبەندی) ناسراوون کە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چەندەها ساڵ ڕشتەی سۆفیەتی‌یان بەدەستەوە بووە و لێی نەبچڕاوون .

## ﴿ نشینگای هۆزی دانەر ﴾

دانەر لە هۆزێکی فراوانە کەنیشتەجێی هەردوو هەورامانی بەشی عێراق و ئێرانیش ، لە هەورامانی عێراق دا زیاتر لە

---

١) ئەم ژیاننامەیە لە کتێبی (پێشهاتی مەرگ ) دا هاتووە .

٢) لە ئەسڵدا سەرگەتیین ، ئێستە وەچەیان لەوێ نەماوە . بەهۆی مەلایەتی و شێخایەتی‌یەوە هەریەکەیان کەوتوونەتە شوێنێکەوە .

(دەرەی مەڕ)[٣] و ( ئەحمد ئاوا ) ن ، وەلە ئێراندا زیاتر لە ( دەمەیەو ) و ( بارام ئاوا )ن[٤] وە زۆریشیان بە هۆی مەلایەتی و کارو بارەوە لە شوێنانی تریش نیشتەجێن .

## ﴿ ژیان و سەردەمی خوێندنی ﴾

دانەر لە ساڵی ( ١٣٦١ هـ) دەستی کردووە بە خوێندنی ئاینی و تێکۆشانی کردووە بۆ زانست و زانیاری لە کوردستانی ( هەولێر . هەڵەبجە . کەرکوك . ڕەواندوز . سولێمانی . خۆشناو . پێنجوێن . دزەیی . مەریوان . قەراج . شاربازێڕ . ژاوەرۆ . شارەزوور . گاوەرۆ . هەورامان . کۆیە . سنە . مەنگوڕ . شامیان . پشدەر . برادۆست . مەرگە . قەرەداغ ) و شوێنەکانی تریش . تەمەنێکی زۆری لە خزمەتی زانست و زانیاری ئیسلامدا سەرف کردووە ، تا لە ساڵی (١٣٧٦هـ / ١٩٥٦ز ) لە سولێمانی لەلایەن (حاجی مامۆستا ملا معروفی خاوی)[٥]دا

---

٣) گوندێکە لە بناری هەورامان . کوردستانی عێراق .

٤) دوو گوندن لە هەورامانی ئێران .

٥) ئەم مامۆستایە لەو سەردەمەدا مودەڕیسی مزگەوتی (بنتەبەق ) بووە لە سولێمانی گۆڕی پڕ نوور بێت .

ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و ڕێگای فەتوای شەرعی پێدراوە .

## ﴿ سەردەمی پاش خوێندنی ﴾

دانەر بە فەرمانی مامۆستایانی ئایینی کراوە بە مودەڕیسی مزگەوتی (شێخ عبدالکریمی کوڕی شێخ عبدالقادر)ی (شێخی تەریقەی قادری) لە دێی ( کرپچنە ) لە ناوچەی ( سەنگاو ) لە لیوای کەرکووك . پاش ئەمە بووەتە مەلای گوندی (گرێزە)ی سەر بە ناحیەی سەیدصادق ، پاش ئەمەش لەبەر ناباری باری ژیانی لەساڵی ١٩٥٩ ناچار پەنای بردۆتە بەر کاربەدەستانی میری و بووەتە مووچەخۆری میری . تا ساڵی ١٩٨٨ ئاوارەی ئێران بووە و ساڵی ١٩٩١ گەڕاوەتەوە کوردستان و کراوەتە قازی شەرعی هەڵەبجەی شەهید تا ساڵی ١٩٩٤ .

## ﴿ مامۆستاو بەرهەمەکانی ﴾

مامۆستا بە زمانی عەرەبی کۆمەڵێك حاشیەی مطوّلی لەسەر (فرائض شرح منهج ) و (منطق تفتازانی ) و (فەریدة) ی سیوطی و ( إیسا غوٚجی ) و (تصریف ملا علی ) و ( کفایة البیتوشی ) و کتێبەکانی ( عروض) هەیە . وە بەزمانی

کوردی کتێبی ( پێشهاتی مەرگ ) و (ڕشتەی پێغەمبەر(ﷺ )
و دیوانێکی شیعری نووسیوە .

## ﴿ دانەر لەگەڵ شیعردا ﴾

ماموٚستا لە شیعردا دەستی هەبووە و لەزۆر بابەتدا شیعری نووسیوە ، بەداخەوە دوو بەرگی شیعرەکانی لە کاتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا بەکتێبخانەکەیەوە و چەندەها نووسراوی خۆیەوە سووتاون وە ئێستاکە تەنها بەرگێکیان ماوە ، وەماموٚستا بەچەند نازناوێکەوە شیعری وتووە لەوانە (کەلەیم ، عەبداڵ ، مەلای هەورامی ) .

## ﴿ کۆچی دوایی دانەر ﴾

ماموٚستای خواناس پاش بەسەر بردنی ( ٦٣) ساڵ تەمەن لە خزمەتی ئیسلامدا لە ئێوارەی ڕۆژی (١٢/٩ / ١٩٩٦) لە ئەحمەد ئاوا کۆچی دوایی کردوە[٦]

---

٦) بە ئەمری خوا لەکاتی نوێژی مەغریب دا و لەسەر بەرماڵ کۆچی دوایی کردووە . پێغەمبەریش (ﷺ ) دەفەرمووێ ﴿ من كان آخر كلامه . لااله الا الله . دخل الجنة ) صحيح الجامع (٥/٢٢٤).
(يبعث كل عبدعلى مامات عليه ) مسلم . حديث (٨٢) (١٧/ ٢١٠).

*بەبۆنەی کۆچی دوایی مامۆستاوە زۆر لە شاعیران مەرسیەیان بۆ گێڕاوە ، ئێستا لێرەدا مەرسیەی شاعیری گەورەی کوردستانی ئێران مامۆستا ملا محمد امینی میرزایی دەخەینە بەرچاو :

## ﴿ شین بۆ مامۆستا شێخ احمد ﴾

کوڕە کوردەکەی شاخی هەورامان
هەڵپڕوسقاوی ناباری زەمان
چەند بەئاوات بووی بۆ ئازادی گەل
چەند گەڕای لەشاخ دەشت و دۆڵ و کەل
بۆ عەجایباتی ژینی کوردەوار
سبحان الله ت کرد هەزار بە هەزار
بەهاری عومرت بە کوێرەوەری
بەداخ و هیجران بە دەربەدەری
تۆش هەروەك کوردی بەش بڕاو لەژین
سەرسام و مات و پەژمووردە و بێ تین
گەڕای بەم هەموو ئەرزی خوادا
هەرگیز ڕات نەکەوت وەلای صەفادا
پاییزی عومرت بە ئاخر خەزان
تەنها گەڵاکەی زەردی هەڵوەران

بـەڕۆحـی بـەرزی ڕوخســـار بەهـاری
کـۆچـی خێـرت کـرد لـە ژین بێزاری
چـوون لـە کۆشـی دڵ ڕوا بــوو ڕیخت
جا غەمخۆری قەوم [7] هات بۆ تاریخـت .

## بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و سەنای بێ وێنەو میثال
بۆ بارەگای حەق خودای ذوالجلال

سەلات و سەلام زۆر و بێ شومار
بۆ زاتـی پاکی ڕەسـولی نـازدار

ئەونەی ئەو شەننەی فەرموویە "کریم"
إنـک لعلـــی خلـــق عظیـــم

هەم ئالو ئەسحاب تابع وەتابع
هەتـا قیامەت قەت نەبێ قاطع

پاشـی سەنـاو درودوە یــەکســـــەر
هۆی کردەم لە باس شێوەی پێغەمبەر (ﷺ)

بۆمنـاڵی کـورد وریا و خواپەرس
ڕشتەی بزانێ هەربە وێنەی دەرس

---

٧) هەر بەجۆرە نووسینە وادەی وەفاتی‌یە .(فسلام‌عليه يوم ولد ويوم مات ويوم يبعث حياً.)

چۆن هەتا ئێستا بەزمان کوردی
کـەمتر کـراوە دشتە تـا وردی

وە کوردی کردم ئامانجە بۆ دڵ
بەڵکو خواوەند پاکم کا لە گـڵ

وە چاوی ئینصاف فەرموون موتاڵای
سەر و خوار و ناو شەش دەری باڵای

گەرنەقدێکیش بوو هیوام بووردنە
توانام ئەوەنـەس ئاخـر مردنـە

(نظم المحاسن ) هۆنـەری (حافی )[8]
لە ڕشتەی ڕەسول دای نابوو صافی

شێوەی بەفارسی هۆنرا بوو ڕاسی
بۆ بەرگی کوردی گـۆڕاومـە باسی

---

٨) حافی خەلیفەیکە لە خولەفای شێخی (سراج الدین) ی تەویڵەیی ، بەڵامێزنی ئیرشادی پێ نەداوە ،بۆم مەعلووم بووە شێخی سراج الدین ئزنی هیچ کەسی نەداوە بۆ ئرشادی طریقة بێجگە لەو کەسانەی کەلە نەتەوەی قوریش بوون ، بەڵکو لەو نەتەوەش مشهووری عامیش نەبووبن ، بە قورەیش . هەر قورەیش نەسەب بوبن هەر لەبەر ئەو هۆیە ئذن ئرشادی پێ داون ، چوون لای شێخ معلووم بووە ، کە قورەیشین وە خۆشیان بەخۆیانیان نەزانیوە ، ئیتر هەر بەرەیەکیان بووبێ / (وتەمان لە حالی نەبڕین ). حالی لە ساڵی (١٢٤٠)ه ، هاتوەتە دونیاوە لە (١٢٨٨)ه (نظم المحاسن) ی داناوە بە زمانی فارسی . هەروەک خۆی ئەڵێت : کزەرار و دوصد و هشتادو هشت هیجدە روز ازدلوماه لندر گزشت .و دانشتووی ئاوایی (سەران ) بووە لە ناوچەی کوردستانی شاری (سنە)دا وە زانایەکی بەرز بووە . لە علومی ئاینی دا .(سەر رحمه الله)

هەرچەن قەڵەم و زیهنم کەساسە
توانــایی زانـام کورتە ئەم باسە

وە تـەمای چـاوە کـوێر تـاوەکوو هەس
گەردوونای گەردوون بۆم بێ فریاد ڕەس

لەسەر تەرتیبی سیەر ئەکۆشم
ناوو نەتەوەی بـەرزی ئەنۆشم

قورەیشی نەسەب هاشم سیەرە
لە گشـــت نەتـەوە موبارەك ترە

نـــاوی (محمد) بارەگـای قەڵا
باوکی بەڕێزی ناوی (عبدالله)

(عبدالـمطلب ) بـاپیری بـــەرزی
کوڕی( هاشمی) شەریفی تەرزی

(عبدالمناف) ە ئۆجاخی (قصی )
(کلاب) و (مره)(کعب) وەهەم (لوی )

(غالب) و (فهر) و (مالك)ە یەکســەر
(نضر) و (کنانە) و (غزیمە)ی بەطەر

(مدرك) و (الیاس ، مضر) و (نزار )
(معد) و (عدنان ) ئێــرەیە قـــەرار

بیستو یەك پشتی بێشك ئەمانە
بەرەو ژوورتــری جێگای گومانە.

﴿ دایـــــــــکی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

دایکـــی (ئامینە ) کچی (وەهب) بوو
پشتاو پشت گشتی نەوەی عرب بوو
داك وبـــابی ئەو کافـــر نەبـــوون
چوون لەسەردینی (إبراهیم ) بوون
بازێکیش ئەڵێن زیندوو بوونەوە
ئیمانیان هێنا دیسان چوونەوە .

﴿ ژیانی پێغەمبەر (ﷺ )﴾

هاتــە دنیاوە لە مەککــەی شەریف
ساڵی (عام الفيل) بە وتەی زەریف
لە چل ساڵی دا وەحی بۆ سەر هات
وەســەر خۆ قورئان پێی کرا خەڵات
ساڵی پەنجاو دوو هیجرەتی بۆکرد
چــوو بۆ مەدینــە وەدەست ووەبرد
بەوەۆیە مێژووی هیجری دانرا
لەنــاو ئیســلاما یاسای پێکرا
بە وتەی صحیح ساڵێ پێش هیجرەت
یــەزدان بــۆ میعــراج بــردی وەسیرەت
لــە (یثرب ) ژیا یازدە ساڵ تەنیا
لە شەست وسێدا دەرچوو لەدنیا

﴿ ژنانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

یازده حەرەمی بووە پێغەمبەر (ﷺ)
وا بــڕیـار ئەدەن مێــژوو هەم سیەر

بێگومان خودا بەرزی کردوون
(أم المؤمنین) نـــاوی بردوون

(خدیــجە) و ( صفیــه ) و (أم حبیبـــه)
(میمونە) و (حفصه) و (هند) و (زینبه)

(عائشه) و( سَودة) (جوریه) و (زینبه)
دوو (زەینەب) نـاوی بــووە بێ ڕەیبە

﴿ منداڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

منــداڵی بــووە ڕەســوڵی سەروەر
لە کوڕ و لە کچ حەوتن وە خەبەر

(عبدالله) و(قاسم ، ابراهیم )کە بوون
هــەروە منــاڵی لە دنیـا دەرچوون

( فاطمەی زهراء ) هــەم (ام کلـثـوم )
(زینبه ) و (رقیه) گشت پاك وبێ بووم.

تەنیـــا ( ابراهیم ) لـە (ماریە)پەیان
لە (خدیجەن ) بێشك ئەوانی تریان

﴿ شێوەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

ببیستــە یـاری دڵسـۆزی ئایـن
چۆنیەتی رسول (ختم المرسلین)

بێ سێبەر بوە لاشەی وەتاکی
لە هەتاوبووبێ یاخود ڕووناکی
هەر بەو شێوەیە لاشەی بە تەواو
ڕاست و ڕێك و پێك سەر و خوار و ناو
ناوەندی بۆە باڵای شەریفی
نەکوڵ و نەدرێژ بەژنی زەریفی
کاتی وەستانی زاتی ئەرجومەند
بینراوە بێشك لە گشتیان بڵەند
گەر دانیشتایە لەهەر مەجلیسێ
شێوەی بەرزتر بوو لە هەموو کەسێ
گەورە و پێکەوتوو سەری بەڕێزی
مووی قەترانی ڕەنگ سەر پاك و پیزی
کات کات مووی سەریهاتووەگوێ یانی
جارجار هاتوونە سەر هەردوو شانی
بیدیایە هەرکەس شێوەی گیوانی
حەیرانی ئەبوو دڵ و چاوانی
ئەهاتە سەما چوون گۆمی شەتاو
وژمی بۆ ئەدا بنۆشێ گوڵاو
بۆنی دوو گیوی وەنەوشە وگوڵاو
گشت کەس لە حاسی بۆی ئەهات هاڵاو

مانـــگ ئەدرەوشـــایۆ وێنـــەی چـاوانی
نەخشەی ناوی مانگ چوون ئەبرۆ وانی

ئەبرۆی پاکژی پەیوەسی بوون
بـــەپێز و قەوی کـەوانی بوون

چاوی بادامـــی نەرگـــز وێنە ڕەنگ
گەورە وهەیبەتی بێڕەنگ وەیا دەنگ

لەناو یا هێڵی سوری چوون کەمەند
مووی برۆی بـووە ڕەش و هەمبڵەند

ڕەشی‌ناو چاوی بێ حەد ڕەش بووە
سپـی چـاوانی‌و ورشـە ڕەنگ بووە

بوە لە چاویـــا نوریــێکی بێ تــــۆز
بە شەو بینیویە هەر بە وێنەی ڕۆژ

بینینی لە پێش چوون بووە عادەت
لە ماوەرایشـا بینیـــویـە سـادەت

هێزی بیستنی وا گوشاد بووە
بیستویە چڤە هەرکات کە بووە

کوڵمـی شیریـنـی زۆر بەرز نەبووە
لەگەڵ ڕومەتیا هەریەك تەرز بووە.

دەنگی ناسکی بووە لەسەر خۆ
کاتـــی وتـــاری تەنیـا یاوە کۆ

هەرکات وتاری دەهێنێ لە ناو کۆڕ
زۆر و کەم هەمووی بەستوویە سەر خۆ

لەهەر جێگایە کۆڕی کە بووبێ
وتەی بیستراوە گەر دووریش بووبێ

سیمای دوولێوی پارچەیە ئەی نوان
خەیاڵ ئەی زانی ئەو هەس لە خەندان

هەرکاتێ دەمی کردایە گوشاد
بە هۆی ئاهووری یان بە هۆی میعاد

لە وتە و گوفتار زمانی ڕەوان
دەنگی پڕ مەزەلای وانا و نەوان[9]

ددانی شەوەی نوورانی و شەریف
بەشێوە وردوو باریکی زەریف

کاتێ وەتاری (خلایق) ئەبەراو
چوون مەست وەستاون بۆ خۆتەی گوێدار

هەرگیز نەبووە قاقای پێکەنین
بویە (تبسم)[10] بەشێوەی شیرین .

شێوەی ڕووی بووە خۆر و ڕۆژگار
درەوشاوەتر بە ڕەنگەی ئەنوار.

---

٩) وانا و نەوان : مەبەست خوێندەوار و نەخوێندەوارە .
١٠) تبسم : زەردەخەنە .

سپی و سوور بوە ڕوومەتی پاکی
بێ گەرد چوون یاقووت وێنەی بە تاکی
سێ بەشی کافوور چوار بەشی عەنبەر
شەش بەشی گەوهەر باقی چوون جەوهەر
ڕیشی شەریفی وە کۆمەڵ گشتی
قەسی کردوە زیاد لە مستی
وە دوێرد کردویە سمێڵی زەریف
لێواری لێوی بینراوە نەظیف
وێنەی گەنم ڕەنگ گەردەنی بڵند
هەرکەس بینیویە بووە شەوق مەند.
شانی بۆ ئەو شان دوور بوون لەیەك
وێنەیان چوون یەك بەسەنگی مەحەك
سینەی بێکینەی پاك و بە زینەت
یەکسان سکوسینە کۆگای بە هیبەت
بوە لە سینەی دەنگێکی تەمین
لێی وە بیستراوە (زکر)ی پاکی دین
دائمە بیرۆنی مات (صفت ) بووە
زۆرتری کاتەکان گریانی بووە
ناوڕاسی سینی خەتێکی پڕ موو
کشا بوو بۆ خوار باقی گشت بێ موو

ناو شان و قۆڵ و باسکی وە یەکسەر
چوون چیمەن پڕ موو قەترانی سیەر
گەیشتوە ئەژنۆی ناولەپی پاکی
وەستا بێ کاتێ باڵای ڕوناکی.

لاشەی شەریفی بتەو و زەریـــف
ناو لەپی بڵاو نەرم و هەم نەظیف
پەنجەی دەست و پێی نەرم و بە زینەت
درێـژ و شیریــن بێ وێنە وبــێ خــەت
هەمیشە یاری ڕێگای سەخاوەت
لەگەڵ نەبوونیش یار بە قەناعەت
ڕەنگی نینۆکی چوون گوڵ و بلور
شۆڵەیان داوە هەر بە وێنەی نوور
دەستـــی بۆ تــەوقە ئاڕاسە و میزان
پڕ دەستی گشت کەس بەوتەی لێزان
درۆشەی دووپێی وێنەی شۆڵەی نوور
لـە ڕەودا ئەدەب کــردوو یــە عبــوور.

کەم گۆشت ، عادەتی ، پاژنەی پیرۆزی
یــاخوو بە زینــەت پێ کــەوتووی هۆزی
ژێـری پێی ڕێك و بێچاڵ و هەم ساف
ئەم سەرتا ئەوسەر وێنەی هێلی جاف

پشتی پێی بێ موو هەم نەرم و شیرین
بێ چاڵ و بێ چۆڵ پڕ نوور و جەمین.
لە ڕەودا سەر خۆ هەنگاوی دەنا
بو بێتی هاوڕێ یا خۆ خۆی تەنیا

﴿ نیشانی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

بوویە لە زک ماك ڕاستی ناو شانی
مۆری (نبوە) بۆ ناو نیشانی
نەخشێکی پیرۆز هەیکەل چوون هەنجیر
نەخشاو بە خاڵی وردورد وێنەی لیر
ڕازاوەی ناو مۆر بە نووسراوی نوور
بەوتەی صحیح( تنجنجهیصور)
مانای ئەو نووسراو بە وتەی‌پڕ نوور
إنك منصور في كل الامور
ئەهلی سەر دەڵێن (رسول الله) هەم
(خاتم النبي) نووسراوە سەرجەم

﴿ نوری دیمەنی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

صحابی ڕەسول (جابر) ی (سمرە)
ڕەزای یەزدانی لێبێ وە بەهرە
ئەڵێ لەمانگی تابانی چاتر
مەر ڕەسوڵ بوبێ بێ گومان خاتر

پەڕەی ڕوخساری پڕ نوور بوو چون ڕۆژ
شولەی ئەدرەوشــا بێ شـك وەبێ تۆز.

(ابوهريره) ئەیـلـێ جـوان تــر
نەبوو كەسێ تر لەوبێ شیرین تر.

ئەدرەوشا شۆڵەی نێوی چاوانی
سەرسام ئەما گشت پیر و جوانی

وا بەیـان ئەكـا (ربیعه)ی صحاب
تەعریفی ڕەسوڵ بە شێوەی نایاب

گـەر بت بینـایە بەچـاوی ڕاسی
ڕۆژبوو هەڵئەهات دیمەنی خاسی

(ابن عباس) یـش ئێژێ هەر بەوجۆر
نوورانی تربوو شێوەی لەڕووی خۆر

چوون مانگی تابان ئەدرەوشا لە شەو
كاتـی بیـداری هـەم لەكـاتی خەو.

لەشەوی تاریك شۆڵەی چوون چرا
ئەدرەوشایەوە گشـت شت ئەبینرا

﴿ بۆنی خۆشی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

فەرموویـە جابر بەشێـوەی بەتین
سەروەری دنیام هەم سەروەری دین

دەستـی پـیرۆزی داوە سەر سیـنما
پەخشان بوو عەتری پاك وە جەمینما

بەو شێوەیە وا سەرسام بووم یەکسەر
خەزنەی عەتر گایش دوورە لە سیەر

(وائل) ی (حجر) فەرموویە جارێ
تەوقەم لەگەڵ کرد لەڕۆژگارێ .

بۆنی عەترمات بە شێوەی تەواو
چاتر لە بۆنی میسك و هەم گوڵاو

خەبەریان داوە زانایانی دین
لە شێوەی لاوی (ختم المرسلین)

پێشخوانی حەضرەت ئاوێتەی نێو خوان
کراوە یەکسان بۆ ندار و جوان .

بە هێزتر بووە بۆنی لە عەنبەر
سەر سوڕسام ماون زانا وەیەکسەر

ماوەی ئەو خۆرەی حەضرەتی ڕەسول
کراوە ناو بیرخۆش بووە بەتول.

لە جەبینی ئەو عارەق گیراوە
لەگەڵ عەنبەرا تێکەڵ کراوە

وابەهێز بووە سەر سوڕ سام ماون
لەم بۆنە یەکسەر بەتول داماون

وتەی (هریرە) لە سوڵتانی پاك
نەبوبۆن خۆشتر لەو لەڕوی‌سەر خاك

﴿ وەرگیراوێك لە پێغەمبەر (ﷺ) دوە ﴾

کچی پیاوێك شووی کرد لە کاتێك
بۆ خزمـەت ڕەسوڵ چونە مەقامێك

قوربان بێدەس بووین تابێین وە حضور
بـۆ موبـارەکـی خۆمـان کەیـن ڕوسور

فەرمووی بێنە بۆم قاپی شوشەیەك
بۆی هێنـا زاوا بەهـەر شێـوەیـەك

لە ڕوی پیرۆزی چەن قەتـرەی عەرەق
گرتی چوون شەونم ئەگرین لە وەرەق

کردیە ناو شوشەچون قەترەی پڕ سوود
دای بە بـاوکی بـووك ئەو (خیر الوجود)

فەرمـووی بە کچـت عطا کـە عـەرەق
بێن خۆش بکا پێی چون گوڵی وەرەق

دای لەشـان و سەر کچی خاوەن سوود
بەخشانی بۆن بوون وەك دارسانی عوود

هەر بـەو هۆیـەوە شۆرەت ئاسـا بـووك
بە هۆزی بۆن خۆش تا مابوون لە دووك

(ئەنەسی ) (مالك) دارای دنیا و دین
ئەڵـێ چون نەجمە دیار بوو لە بین

ئەگوزەرا هەرکات حەضرەت وە هەرجێ
بۆنـی عەتـر میسـك نەئـەبرا لەوجـێ

بە چەنان ماوە ئەوجێ و مەکانە
چـوون عەتـر ئازا کـرابێ لانە

بوورا بێ هەرکەس بەو جێگە وەسەر
ئەیـزانی حـەضرەت کردوویە گوزەر

﴿ مناقدباتی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

( الله الله) لەو جەماڵە و لەو کەمال
ئافەرین بۆ سەروەرێ داینا (جلال)

(الله الله ) لەو جەمینە و لەو جەسەد
ئافەرین بۆ دیمەنێك داینا (صەمەد)

(الله الله ) لەو ڕۆحەی پاك و جەمین
ئافەرین بۆ ڕشتەکەی گیان ئافەرین

بۆ گـرۆهی ئادەمیـزاد بۆ نیشاط
خۆشیو و بەرزی نیگاری سەر بیصاط

چاکە دا نـازاتی پـاکی دادگــــەر
هەر لەپشتی ئادەما دای "خیر البشر"

خۆیشی‌ناوی یەکسەری‌نا(رحمة للعالمین)
پێشی‌دا ڕێگەی‌شەفاعەت بۆگرۆهی‌مۆمنین

خۆ دیـاره بـەرزی رەحـمی بۆ یـەقین
ئەمن و ئادەم بۆ شەفاعەت چوون یەکین

هـەم کلیلـی ڕەحمەتـی پێـداوە یەکسەر
هیوای پەخشان ئەکا عالەم لە شەش دەر

خۆشیو و مژدەبە جاریێ بۆ گرۆهــی مۆمنــین
شافعی ڕۆژی سزایە حەزرەتی ختم المرسلین

واڵە خۆشی و سەربەسی بوونی جیهان
بۆ دیــاری شەوقــی سرور پاك نیهــان

هەرکەویستی ڕێی ببێ چێ بۆ حضور
تن بکـا عنــبر هەم عبــیر و هــەم بخور

ئەو هەمیشە زکرو فکری بێ وەنام
زکری صلواتی لەدەم بێ بۆ پەیام.

دا دەکــەم داوا ئەکـا زاتی خوا
زانەری چاکە و خراپەی ماسیوا

بــۆ درودی ئیــو و زاری ســەر زمــان
خاوەن خەزێنەی نهێنی و هەم زەمان

هەم بەپاکی دیــمەنی ڕۆحــی بەڕێز
بمخەرە کوڕی شەفاعەت ڕۆژی ستێز

وام لە قاپــی بارەگاتا بۆ نەوا
ڕێزی میوان واجبە زاتی خوا

تۆ(کەڵەیم) و (حافی ) سەرخە لەو ڕێباز
تا تکاکەم ڕەحمەت عطاکەی سەرفــراز

خۆ(کەڵەیم) قابیــل نیــە بۆ ڕێــی نیـدا
بەس بە فەزڵی خۆت کەرەم کەی ئەی‌خودا

تۆ عەفـووی کە مجرمـەی کۆگای عیوب

بەس ئەزانیٚ هەر بە تۆی بەخشنی زنوب

﴿پارانەوەیەکی (کەلەیم) بە هۆی تەواو بوونی :ڕشتەی پێغەمبەر (ﷺ)ەوە﴾

ئەی خواوەندی کەریم و ئەی خاوەنی هێزی عەزیـم

من ئەبینم تۆ لە دودون هەر تۆی هەی (رحمن الرحیم)

ئەوەندە زۆرە چاکەی تۆ ئەی بەتەنیای ئەی ودوود

سـەر بەسـەر پۆشیـوتە تاکـو گاور هـەم یەهـوود

ڕەحمەت و چاکەت تەواوی دابەشە بۆ ما سیوا

چۆن لە ئێستا من ئەمێنم هەر لەجێ دا بێ نەوا

یارمەتی هەرکەس ئەدەی تۆ پڕ بەرە مەیلت ببێ

بیٚ وتە کەیلـی ئەکەی گەر ئارەزوو کەیفـت ببیٚ

تۆ (کریم العفو) ی باری هەم خاوەنی لتفو عەطا

من (کثیر الذنب )و گومـڕا و بەدنـەوا و پڕ خەتا

صەد درێغ لەم عمرەپوچەم والەدەم کەل ڕۆی بەساڵ

وا کـە گرتی ڕیٚ ی بەتاڵیـو وابوو ئیمـڕۆ پایـە ماڵ

چەندە جار کردوومە تۆبە هەرلەسەر کرداری بەد

عاقیبـەت یەك یەك شکاندم (یاکریم) و( یاصمد)

هەر بەزارەو باز ئەڵێمـە و ئەی (غفور)ی دادگـەر

وەك نصوحت یاوەرم بەچوون ڕێگاکەم هەسخەتەر

هەقی گیانی پاکی (ئەحمد) خۆت بە (مختار) دارتە باز

تۆ پەنـامدە ڕۆژی مەحشـەر هەم بدە پێم ڕێی نیاز

تابب‍ـم یارت وە یاکـــوو یاوەری یـاری (صدیق)

دوورلەغەیر بم ڕیٚ گوزەرکەم تا بە قاپیت بم ڕەفیق

هەقی پاکی صالحانت تۆ بکە ئیرشـــادی من

لەم جیهان و پاشە ڕۆژیش تۆ بکە فریادی من.

خۆ بریندارە کـە لاشـەم ناگەسە بێمە حضور

تو ببەخشە گشت گوناهم تا ببێ بۆم ڕێ عبور
داك و بابم هەروەهایە تۆبە ڕەحمەت شاد بکە
لەو عەزابی پاشە ڕۆژە یەکسەری ئازاد بکـــە
کۆمەڵــی ئەولادەکـانم لەم جیهانەی پڕ زەبـــوون
دووریان خەڵتۆ لە نەفس و ناڕەوایی هەردوو دوون
خۆم لە چاکە دوور بوم و بەس ئومێدم هەس بەگیان
تەربیــەت ئارا بکـەی بۆم ئال و بەیتــم گشتیـــان
بۆڕەوشت و خووی شەفاگەر بۆ گەلی کۆڕی بەشەر
تا بزانن دڵ بە غیرەت بـۆ خـوادا بـن کارگـەر
من هیــــوادارم بـە لوطفــت (یـاکریـم المستـعـان)
حەقی شاهی (احمد)ی حەق هەم خاتمی پێغەمبەران
یەك بەیەك گشتیان ئەواکە بۆ بەندەیی ڕێگەی ئیدا
بۆ دەری قاپی شوناسیت ئەی( کەریم ) و ئەی خودا
تانەکەونە تافی گێژاو هەم مەلال ڕێی خەبیس
گیان و دڵیانتۆ پەنادە لەو هەموو ڕێبازی پیس
یەك بەیەك گشتیان ڕەواکە بۆ دەری (خیر البشر)
هەم لە زنجیرەی گەرەمتا تۆ بـدە بەشیـان کەرەم
چوونکە سودی چاکەیان خۆ بۆ دەرون و شانی من
هۆی نەجات و سودە یەکسەر بۆ نزولەی گیانی من
وانەبێ من قطعی ڕەحمم کرد بێ ئەی (ذوالجلال)
ئەمرە داوا بۆ ئیجـابەیـش واتە تە ئایەی کمـال
(حاڤیا) ڕۆژی دوسەد جار بۆ (کەلەیم) حەق هـەس تەواو
بۆت بنێـرێ ڕەحمەتــی پاك چــوون وتــارت هــاتە نـاو.

## سبحان ربك رب العزه عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين



دامنا وێنەی زەبونم بـابیێ بـۆ یادگـار

عاقیبەت ڕۆحم کە دەرچوو یاوەرە بۆ خزم و یار

ژمارەی سپاردنی ( ١٠٢ ) ی ساڵی (٢٠٠١) ی پێدراوە